## وتەکانی پاولۆ کۆیلیۆ

(٣)

# عاریفانە

وەرگێڕانی

یوسف محەممەد و کارا فاتیح




**ناوی کتێب: عاریفانە**

- وتەکانی پاولۆ کۆیلیۆ (٣)
- وەرگێڕی فارسی: نەفیسەی سوڵتانی
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: یوسف محەممەد و کارا فاتیح
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزاد
- پیتچنین و هەڵەچن: کارا فاتیح
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ٨٧٥
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ١٥٠٠ دینار

زنجیرەی کتێب (١٩٧)





دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

www.mukiryani.com

asokareem@ maktoob.com

Tel: 2260311

خۆبەزلزانین و خۆپەسەندی لە زۆرێك لە حاڵەتەكاندا دەمامكێكی بێنرخن لە ترس و دڵەڕاوكێ.

❁ ❁ ❁

هەڵبژاردنی بێدەنگی هەمیشە تەنها بەمانای دەستهەڵگرتن لە قسەكردن نییە، بەڵكو فێربوون و راهێنانێكی گوونجاوە، بۆ بیستنی تەواویی ئەو شتانەی لە دەوروبەرماندا تێدەپەڕن.

❁ ❁ ❁

هەرگیز نابێت سەیری پشتەوەی سەرمان بكەین.

❁ ❁ ❁



لە سەرەتای دروستبوونی ئەم دونیایەدا نادادپەروەری زۆر بچووكتر و كەمتر بوو، بەڵام هەر كەسێك كەمێكی بۆ ئەم نادادپەروەرییە زیادكرد و هەنووكەش دەبینن كە ئەمڕۆ بە كوێ گەیشتووین.

❁ ❁ ❁

پێویستیی هەبوونی شتێكی دیاریكراو - هەندێكجار شتێكی بچووك و بێئەرزشیش- دەبێتە هۆی ئەوەی ببینە زیندانیی ئەو شتە.

❁ ❁ ❁

هەموومان خۆمان بۆ كوشتنی ئەژدیها ئامادەدەكەین، بەڵام دواجار بەهۆی ئەو مێروولە بچووكانەی، هەرگیز گرنگیمان پێنەداون هەپروونبەهەپروون دەبین.

❁ ❁ ❁

کەسێك کە خودا دەناسێت وەسفی ناکات، کەسێك کە خودا وەسفدەکات، نایناسێت.

❈ .❈ ❈

گەمژەترینی کەسان ئەوانەن، کە خۆیان بە داناترینی خەڵکان دەزانن و بۆ هەر شتێك راڤە و روونکردنەوەیان گەرەکە.

❈ .❈ ❈

گەورەترین ترس ئەوە نییە کە لە ئەنجامدانی کارێك بێتوانا بیت، بەڵکو باڵاترین پلەی ترس و تۆقین ئەو کاتەیە لەوە ئاگادار دەبین کە زۆر زیاتر لەوەی بیرمان لێدەکردەوە، بەتواناترین.

❈ .❈ ❈



سەفەر باشترین شێوازی فێربوونە.

❈ .❈ ❈

ئەگەر ئێوە دوو باڵندە پێکەوە ببەستنەوە، ئەوان چوار باڵیان دەبێت بەڵام هەرگیز ناتوانن بفڕن.

❈ .❈ ❈

هیچ شارێك هیچ کات لە جێگەی خۆی ناجووڵێت، لەشکرێك دەتوانێت لەناوی بەرێت بەڵام شار بۆ هیچ شوێنێك ناڕوات.

❈ .❈ ❈

هەندێ کات بۆ فێربوونی کارێکی گرنگ و چاك، پێویستە کەمێك توندوتیژیش بەکاربهێنرێت.

❋ .❋ ❋

خوداوەند بەشی خۆی ئەنجامداوە، هەنووکە ئەوە ئەرکی ئێمەیە کە ئەم پرۆسەیە درێژەپێبدەین.

❋ .❋ ❋

هەندێ لە کێشەکان قبووڵبکەن، بۆئەوەی بتوانن لە بەرامبەر هەستی کوشندەی خۆبەگەورەزانیندا بوەستنەوە.

❋ .❋ ❋



نە حساب لەسەر سووکایەتی و شکاندنەکانی خەڵکانی تر بکەن، نە لەسەر پیاهەڵدان و ستایشەکانیان، بەم شێوەیە ئێوە دەتوانن رێگای خۆتان دروست بکەن.

❋ .❋ ❋

هەموان خاوەنی ئەم مەیلەن، کە بەپێی ژینگەی دەوروبەریان گەشەبکەن.

❋ .❋ ❋

گوومان و شکن کە بوونەتە هۆی گەشەی ئێمە و وامان لێدەکەن بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ سەیرێکی هەموو ئەو وەڵامە زۆرانە بکەین کە بۆ تاکە پرسیارێك بوونیان هەیە.

❋ .❋ ❋

ئەگەر دەتانەوێت هەر نەعلەت و نەفرینێك لە خۆتان دووربخەنەوە، هەرگیز نابێت گرنگییان پێبدەن.

❋ ❋ ❋

کاتێك ئەم دونیایە درکپێدەکەین، کە لە هۆکارەکانی ئاگاداربببینەوە.

❋ ❋ ❋

ئەو کاتەی هەست بە گوناه دەکەین، بەشێوەیەکی نائاگاییانە ئارەزووی سزادانی خۆمان دەکەین.

❋ ❋ ❋



زانستی بەساڵاچوان ئەمەیە: گۆڕینەوە و مامەڵەپێکردنی سەرکەوتنە خێراکان بە سەرکەوتنە بەردەوامەکان.

❋ ❋ ❋

ئەگەر نوێژنەکەین، هەرچەند خواوەند هەمیشە نزیکیشمان بێت، کەچی هەرگیز ئاگاداری ئامادەبوونی ئەو نابین.

❋ ❋ ❋

بە بیرکردنەوەی زۆر دەگەینە چاکەی باڵا و زانست.

❋ ❋ ❋

هەر کارێ کە ئێمە دەیکەین هەرچەندێ بێمانا و پووچیش بێت، دەتوانێت بۆ سەر رێی راست رێنوێنیمان بکات.

❋ .❋ ❋

هەموو ئەو شتانەی لە بەرامبەر ئێمەدا بوونیان هەیە، شانس و هەلی فێربوون و فێرکردنمان پێدەبەخشن.

❋ .❋ ❋

هێرشی راستەوخۆ، تەنهارێی بەرەنگاربوونەوەی هەر کێشەیەکە کە لەئارادایە.

❋ .❋ ❋



هەمووومان لەڕاستیدا میوانانی ئەم دونیایەین.

❋ .❋ ❋

کەسێك کە دەیەوێت مامۆستایەك بێت، دەبێت تەنها یەك بوار هەڵبژێرێت، تا تێیدا بگاتە قۆناغی کامڵبوون.

❋ .❋ ❋

زۆر کات مرۆڤ ئیمانی بەو شتە نییە، کە حەزدەکات ئەوانی تر بڕوای پێبکەن.

❋ .❋ ❋

زۆر کات ئێمە خۆمان توانا و لێهاتووییەکانمان دەکوژین، چونکە نازانین چییان لێ بکەین.

❋ ❋ ❋

ئێوە هەر بەو شێوەیە و هەر بەهەمان ئەو پێوەرانە دادگاییدەکرێن، کە بەهۆیەوە ئەوانی ترتان دادگاییکردوە.

❋ ❋ ❋

کەسێك کە لە بەرامبەر بێڕەحمییەکانی ژیاندا دەسڕدرێتەوە، خزمەتی هێزەکانی تاریکی دەکا و هەمان کەس ڕۆژێك دووبارە بۆلای حەقیقەت دەگەڕێتەوە.

❋ ❋ ❋



هەندێجار چەند هەنگاوێك لەولامانەوە بێدادی دەبینین و بێدەنگ دەبین: (نامەوێت خۆم بخەمە نێو ململانێکەوە.) تەنها بەهانەیەکە و هیچی تر.

❋ ❋ ❋

خراپترینی هەنگاوەکان، یەکەمینیانن.

❋ ❋ ❋

ئەگەر براکەمان بڕستی هاوارکردنی نییە، ئەوە ئێمەین کە دەبێت ئەم کارەی بۆ ئەنجام بدەین.

❋ ❋ ❋

هەر کەسێك هەستی نهێنیدۆزینەوە لەدەستبدا، بە شێوەیەك لە شێوەکان هەستی زیندووبوونیش لەدەستدەدا.

❋ ❋ ❋

پێویستیی دەستخستنی شتانی جیاواز لە ژیاندا، دەمانکەنە زیندانیی ئەو شتانە.

❋ ❋ ❋

هەرگیز مەهێڵە هۆشیارییت لە عەیبەکانت بتترسێنێت.

❋ ❋ ❋



لەدەستدانی بەشێك لە شتێك، باشترە لە لەدەستدانی تێکڕای ئەو شتە.

❋ ❋ ❋

ئێمە خۆمان بە عاقڵ دەزانین، بەڵام کاتێك دەکەوینە ناو تەڵەوە، دەستهەڵناگرین لەو شتەی بەدەستمان هێناوە.

❋ ❋ ❋

ئەو کاتانەی وانەکانی رۆژانەی ژیانمان فێردەبین، دەبێت جۆشوخرۆشە منالآنەییەکان و حیکمەتی بەرهەمی ئەزموونەکانیشمان پێکەوە ئاوێتەبکەین.

❋ ❋ ❋

کار بە ئاینی خۆتان بکەن، هەرچییەك هەیە.

❋ .❋ ❋

پێشگۆیەك پێشبینی ناكات، بەڵكو ئافراندن و دەركەوتنی ئایندە دەبزوێنێ و ئامانجی پێ دەبەخشێت.

❋ .❋ ❋

مرۆڤ دەتوانێت پێشتر ئایندەی خۆی دروستبكات، بەو مەرجەی بڕیاربدات درێژە بە ڕێگاكەی بدات.

❋ .❋ ❋



مرۆڤ دەبێت لە رابردوو رزگاری بێت و لە نێوان ئەو ڕێگایانەی دەخرێنە بەردەمی باشترینیان هەڵبژێرێت.

❋ .❋ ❋

ترس هەمان ئارەزووی شاردراوەیە.

❋ .❋ ❋

بۆ هۆشیاربوون لە توانست و لاوازییەكانتان هیچ كەس لە خۆتان شییاوتر نییە.

❋ .❋ ❋





ئەگەر رۆژێك بهێڵن بەهۆی بیرۆكە و بڕوایەكی بێگانەوە ژەهراوی بن، بێشك دەمرن.

❋ . ❋ ❋

ئێمە لە حاڵەتی تێپەڕین لە ژیانێكەوە بۆ ژیانێكی تردایین و، ناتوانین لە كردارە چاكەكانمان زیاتر شتێكی تر لەگەڵ خۆمان بەرین.

❋ . ❋ ❋

ئەو كاتەی دەبینە خانەخوێ و پێشوازیكەری كەسێك، لەراستیدا دەبینە پێشوازیكەری سەرگووزشتە و سەربووردە و نهێنییەكانی ئەوانی تر.

❋ . ❋ ❋



ئێمەش دەتوانین وەك شارێكی بەجێهێڵراو بگەینە كۆتایی رێ، یان هەروەك درەختێكی سەخاوەتمەند كە پاش بڕینیشی هێشتا هەر بەسوود و كاریگەر دەبێت، سەرچاوەی چاكە بین.

❋ . ❋ ❋

هەر كەسێك بیەوێت بیسەلمێنێت تەنها حەق بەوە، لە گوومڕاییەكی تەواودا دەمێنێتەوە.

❋ . ❋ ❋

لە جەنگدا توانستی خافڵگیركردنی بەرامبەر، كلیلی سەركەوتنە.

❋ . ❋ ❋





مرۆڤە بێمەسرەفەکان هەمیشە خۆیان بە گرنگ دەزانن و هەموو بێکەڵکییەکانیان لەپشت رووکارێکی بەدەسەڵاتەوە دەشارنەوە.

❋ ❋ ❋

کلیلی عیرفان هەوڵدانە بۆ بینینی ئەو شتەی کە لە پشت هەموو شتێکەوە شاردراوەتەوە.

❋ ❋ ❋

زەین دەتوانێت هەر کارێك ئەنجامبدا. هەموو شتێك تەنها ئەو کاتە روودەدا کە رێی پێدەدەین.

❋ ❋ ❋



شەڕی درێژخایەن تەنانەت وڵاتی سەرکەوتووش وێراندەکات.

❋ ❋ ❋

ئیمان ئەگەر باش پەروەردە بکرێت، لە بەرامبەر هەر نائومێدییەکدا بەرگری دەکات.

❋ ❋ ❋

کەسێك بە ئیرادەی ئازادی خۆی رانەوەستێت، سەرەنجام لەلایەن ژیانەوە ئیفلیج دەبێت.

❋ ❋ ❋





لێوەشاوەیی فەرماندەیەکی باش، لە گۆڕینی ئیرادە جیاوازەکانەوە بۆ یەك ئیرادەی یەکگرتوودا دەردەکەوێت.

❈ ❈ ❈

ئێمەین تەجەللابەخشی بیری خواوەند. ئەو چاوەڕێدەکا ژیانی ئێمە شایەنی ئەمە بێت.

❈ ❈ ❈

هەروەك چۆن هیچ کەس ناتوانێت یارمەتیمان بدات، تا سەیری ئۆقیانووسەکان بکەین، ناتوانین لە چاوانی هیچ کەس بۆ تێگەیشتن و لێکجیاکردنەوەی ئەو شتەی روودەدات، سوودوەربگرین.

❈ ❈ ❈



جەنگاوەری رێگای رۆشنایی، بڕیارەکان بۆ دواتر دواناخات.

❈ ❈ ❈

جەنگاوەر دەزانێت چۆن لە نێوان ئەو شتەی کە نەبینراوە و ئەو شتەی ئەبەدییە، جیاوازی بکات.

❈ ❈ ❈

ئەو کاتەی کە دوژمن بە بەهێزتر دەبینین، ئەوەی گرنگە ململانێ نییە، گرنگ دەرەنجامی شەڕە.

❈ ❈ ❈





ئـەو کاتـەی بـە ئەنـدازەی پێویـست هێـزت هەیـە، لـەوەی کـە خۆت بە لاوازتر بنوێنیت، شەرمەزارمەبە.

❋ . ❋ ❋

جـەنگاوەری ڕێگـای ڕۆشـنایی، بـۆ زاڵبـوون بەسـەر خـوددا، لـە هەموو شتێك سوودوەردەگرێت.

❋ . ❋ ❋

مرۆڤە سەرکەوتوەکان هەڵەکانی خۆیان دووبارە ناکەنەوە، هـەر لەبـەر ئەمەشـە جـەنگاوەری ڕێگـای ڕۆشـنایی دڵـی بـۆ شـتێ ناخاتە مەترسییەوە، کە بەهای ئەوەی نەبێت.

❋ . ❋ ❋



جەنگاوەری ڕاستەقینە ڕۆژەکانی خـۆی بـەفیڕۆنادات، تـا ڕۆڵـی کارەکتەرێك ببینێت، کە ئەوانی تر بۆیان هەڵبژاردوە.

❋ . ❋ ❋

جەنگ هیچ پەیوەندییەکی بە کینە و دەمەقاڵێوە نییە.

❋ . ❋ ❋

جیهان بە وێنەی یاری شەترەنجە، کە بزاوتە ڕۆژانەییەکانمان داشەکانییەتی و یاساکانی سرووشتیش بنەماکانی یاریەکەن.

❋ . ❋ ❋





جەنگاوەری رێگای رۆشنایی، هەمیشە باشترین بەشی بوونی خۆی پێشکەشدەکا و هەرئەمەش لە خەڵکی تر چاوەڕێیە.

❁ .❁ ❁

هەموو جەنگاوەرانی رێگای رۆشنایی، چەندانجار گووتوویانە (بەڵێ)، لەکاتێکدا ویستوویانە بڵێن (نا).

❁ .❁ ❁

خودا رێگای ئێمە بە هەنگاوەکانی خۆمان دروستدەکات.

❁ .❁ ❁



جەنگاوەری رێگای رۆشنایی، کاتێک کارێک دەستپێدەکا تا کۆتایی لەگەڵیدا دەڕوات.

❁ .❁ ❁

ئەو کەسەی کێشەکان ناناسێت، دەرگا بە والآکراوی دەهێڵێتەوە و کارەساتەکان لێوەی دێنەژوورێ.

❁ .❁ ❁

جەنگاوەری رێگای رۆشنایی، بەر لە دەستبەکاربوون بیردەکاتەوە و هەموو شتێک هەڵدەسەنگێنێت.

❁ .❁ ❁

هێزی شمشێر پێویستی بە وشە نییە.

❋ . ❋ ❋

جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، هەوڵدەدات ئارامیی خۆی بپارێزێت و هەر هەنگاوێکی بە گرنگترین هەنگاو حسابدەکات.

❋ . ❋ ❋

ئەو کاتەی کە دەستپێکەرێك پێداویستییەکانی خۆی دەناسێت، هۆشیارترە لە دانایەکی بێخەیاڵ.

❋ . ❋ ❋



جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، دەتوانێت تەنهایی هەڵبژێرێت بەڵام ناهێڵێت بەسەریدا بسەپێنرێت.

❋ . ❋ ❋

لە بەرامبەر کێشەکاندا ئیبلیس دەڵێت ئێمە لاوازین و، دەیەوێت دڵنیامان بکاتەوە کە هەڵە لەلایەن ئێمەوەیە، فریشتە داوامان لێدەکات بیر لە ڕەفتاری خۆمان بکەینەوە، هەندێجار پێویستیی بەوەیە لە زمانی یەکێکی ترەوە قسەیەکمان بۆ بکات.

❋ . ❋ ❋

خوداوەند هەرگیز بەندەکانی بە تەنها جێناهێڵێت، بەڵام ناکرێت پێشبینیی ئیرادەی ئەو بکرێت.

❋ . ❋ ❋

هێزی ئاو لەمەدا شاردراوەتەوە: هەرگیز چەکوش ناتوانێت بیشکێنێ و چەقۆش ناتوانێت بیبڕێت.

❁ ❁ ❁

جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، ناهێڵێت لەبەردەم بەدواداچوونی ئامانجەکەیدا شتێك ببێتەڕێگر.

❁ ❁ ❁

جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، هەرگیز دیاری لە دوژمن وەرناگرێت.

❁ ❁ ❁



نابێت فەرامۆشی بکەین کە لە هەندێ چرکەساتدا هێز کاریگەرترە لە زیرەکی.

❁ ❁ ❁

مرۆڤ دەتوانێت لە بەروبوومەکان چاوپۆشی بکات، بەڵام ناتوانێت بەرامبەر بە دەرەنجامەکان بێباك بێت.

❁ ❁ ❁

هیچ کەسێك لە دەرەنجامەکانی دڵڕەقیی خۆی بەئاگا نییە.

❁ ❁ ❁

تــەنها کەســێك دەتوانێــت بانگەشــەی چاوپۆشــیکردن لــە بەرهەمــەکانی کــاری خــۆی بکــات، کــە شــەیدای چــوونە نێــو جەنگــە و دەرەنجامــەکانی ســەرکەوتن هــیچ کەمەندکێــشییەکی بۆی نییە.

❅ .❅ ❅

جــەنگاوەری رێگــای رۆشــنایی، ســەرنجدەداتە شــتە بــچووکەکان، چونکە لەوانەیە ببنە هۆی خراپەیەکی گەورە.

❅ .❅ ❅

جــەنگاوەری رێگــای رۆشــنایی، لەگــەڵ هاوڕێکانیــدا ســەمادەکات، بەڵام بەرپرسیارێتیی هەنگاوەکانی بەوی تر ناسپێرێت.

❅ .❅ ❅



لە مەلەکووتدا جێگایەك بۆ پێشداوەران و نەگوونجاوان نییە.

❅ .❅ ❅

لــە بەرامبــەر ســتەمدا، ئــازادی چــەمکێکی قــابیلی درکــە و بەمانای بەندەنەبوونە.

❅ .❅ ❅

یەکەمین فێربوونی جوامێری ئەمەیە: ئـەوەی تـا ئێـستاکێ لـە پەڕاوی عومری خۆتدا نووسیوتە، یەکسەر بیکوژێنیتەوە.

❅ .❅ ❅





جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، هەروەك زۆرانباز لە هێزی گەورەی خۆی بەئاگایە و، هەرگیز لەگەڵ کەسێکدا کە شایەنی شانازیی ململانێی نەبێت، ناجەنگێت.

❋ . ❋ ❋

کەسایەتی، تەنها کاتێك دەتوانێت گەشەبکات کە بینێرینە جیهانەوە.

❋ . ❋ ❋

ئەو کەسەی چارەڕەشی بە چاوێکی بێباکەوە سەیردەکات، لە هەموان چارەڕەشترە.

❋ . ❋ ❋



ئەو کاتەی کە سەرکەتن، مەوەستن لە چارەسەرکردنی کێشە گەورەکانی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تردا. لەسەر بیرەوەریی چرکەساتە ئازاردەرەکان مەوەستن، تەنها بیر لە شادومانیی تێپەڕین لە تاقیکردنەوە بکەنەوە.

❋ . ❋ ❋

داننان بە ئیمانی مرۆڤێکدا لە کردارەکانییەوەیەتی، نەك لە وتەکانی.

❋ . ❋ ❋

هەر جارێ دەتانەوێت کارێکی چاکە بکەن، بەر کەسانێك دەکەون کە دەیانەوێت وەها بکەن، هەندێجار بە شێوەیەکی ئێجگار باشتریش لە ئێوە. ئیرەیییان پێ مەبەن.

❋ . ❋ ❋

ئیرەیی هەمیشە لە بۆسەی لەناوبردنی کاری ئەوانی تردایە، تەنانەت ئەگەر بۆ ئێمەش چاك بێت.

❋ .❋ ❋

ئەوانەی پێشداوەری دەکەن، لەوانەیە فیردەوس بکەنە شوێنێکی تەحەمموولنەکراو بۆ خۆیان و ئەوانی تریش.

❋ .❋ ❋

بۆ ڕۆیشتنە نێو مەلەکووتی ئاسمانەوە، مرۆڤ دەبێت ڕێگە بە فیردەوس بدات بێتە نێو ڕۆحییەوە.

❋ .❋ ❋



ئەگەر پیاوی نەگوونجاو سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی نەبێت و، هەموو ئەو شتانەی کە بە دادپەروەر و راستی دەزانێت، نەخاتەلاوە، ناتوانێت بە سادەیی بڕواتە نێو مەلەکووتی ئاسمانەوە.

❋ .❋ ❋

باشە کە بزانین هێشتا لێرە و لەوێ خەڵکانێك هەن بۆ خراپە بێمەیلن، چونکە هێشتا گرنگیی کاری چاکەیان نازانن.

❋ .❋ ❋

چ بزوێنەرە، چ پڕ بەرەکەتە، تێپەڕاندنی ڕۆژێکی تەواو بەبێ مەیلی هیچ خراپەیەك.

❋ .❋ ❋





ئەو کاتە هەستدەکەین کەسێك دەتوانێت باشتر ببێت، ئەگەر وا هەستبکات کە ئێمە بە هاوئاستی خۆمان لێی دەڕوانین، ئەو کات گوێ بۆ قسەکانمان دەگرێت.

❊ .❊ ❊

ئەگەر بزانیت چۆن وەسوەسەکان وەلابنێیت، هەرگیز تووشی ئازار نابیت.

❊ .❊ ❊

کەسێك کە تەنها بەدوای نوورەوەیە و گوێ بە ئەرکەکانی نادات، هەرگیز نوور نادۆزێتەوە.

❊ .❊ ❊



ئەگەر کەسێك بەڕاستی بڕوای بە خودا هەبێت، دەبێت قبووڵی بکات کە ئازاد نییە، چونکە خوداوەند بەسەر هەموو جووڵەیەکدا زاڵە.

❊ .❊ ❊

ژیان وەکو ئەم دیوارانە وایە و، چارەنووس هەروەك ئەو هاوارەیە کە ڕەنگە هەر یەك لە ئێمە بیکات. هاواری ئێمە دەدات لە سنگی دیوار و بەهەمان شێوە بۆ لای خۆمان دەگەڕێتەوە.

❊ .❊ ❊

بڕیارەکانی خودا هێمادارن، بەڵام هەمیشە لە قازانجی ئێمەن.

❊ .❊ ❊





ئەگەر تەنها شریتی شکستەکانمان تەماشابکەین، نائومێدییەکان ئیفلیجمان دەکەن.

❃ ❃ ❃

ئەگەر تەنها شریتی سەرکەوتنەکانمان تەماشابکەین، دووچاری لووتبەرزی دەبین و خۆمان لەوە بەداناتر دەزانین کە هەین.

❃ ❃ ❃

هەرگیز ناتوانیت بەدوای خودادا بڕۆی، لە کاتێکدا دڵت لەم سۆراغەدا راڕایە.

❃ ❃ ❃



هێشتنەوەی دووری دەبێتە هۆی ئەوەی کە گرنگ و متمانەبەخۆ بنوێنیت، بەلاَم بەڕاستی ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی رێ بە فریشتەی خۆمان نەدەین، لەنێوان وشەکانی ئەوانی تردا خۆی ئاشکرابکات.

❃ ❃ ❃

لەوەی ئەمڕۆ، بەیانی و لە پاشماوەی تەمەنتدا ئەنجامی دەدەیت، بەوردی بیربکەرەوە.

❃ ❃ ❃

کەسانێك کە رێگایەکی نوێ دەستپێدەکەن، بەلاَم دەیانەوێت تۆزقالێك لە ژیانی پێشووتریشیان لەگەڵدا بێت، رابردوویان عەزابیان دەدات.

❃ ❃ ❃





له تهواوی ئهو بههرانهی خوداوهند ئهمڕۆ به تۆی داوه، بههرهمهندبه. ناتوانرێت بههرهكان زخیرهبخرێن.

❋ . ❋ ❋

ئهگهر سوود له بههرهكانی خوداوهند وهرنهگرین، بۆ ههمیشه لهدهستمان دهچن.

❋ . ❋ ❋

یهكبوون بۆ ئامانجێكی دیاریكراو، بهو مانایهیه كه رێ به ههر كهسێك بدهین به شێوازی خۆی له ئامانج نزیكببێتهوه، ئهمه رێگای كهسانێكه كه دهیانهوێت لهگهڵ خودادا له پهیوهندیدا بن.

❋ . ❋ ❋



له ساتهوهختی چارهسهركردنی كێشهكاندا، هیچ كارێك له دواكهوتن خراپتر نییه.

❋ . ❋ ❋

به شێوهیهكی ئاسایی دهرفهتمان ههیه بۆ ئهمدهست و ئهو دهستكردن، بهڵام ههندێ بارودۆخ دێنهئاراوه كه دهبێت چاكی لێههڵبماڵین و كێشهیهك چارهسهربكهین.

❋ . ❋ ❋

به بێپهرواییییهوه بهرهنگاری رێگاكهت بهرهوه، له گازندهی خهڵك دڵسارد مهبه.

❋ . ❋ ❋

ئەگەر لە قبووڵکردنی بێتواناییەکانت ئینکاری بکەیت، هەرگیز ناتوانیت لە شەڕیان رزگارت بێت.

❋ ❋ ❋

ئەگەر توانستەکانت لە ئێستادا قبووڵبکەیت، گوومانی تێدا نییە کە لە داهاتوودا دەتوانیت باشتریان بکەیت.

❋ ❋ ❋

کەسێك کە بۆ من دەدزێت، لە داهاتوودا لە منیش دەدزێت.

❋ ❋ ❋



هەوڵدان بۆ کورتکردنەوەی رێگا، هیچ سوودێکی نییە.

❋ ❋ ❋

ئەو کەسەی کە دەبەخشێت، دڵی خۆی دەشوات و پاکژی دەکاتەوە.

❋ ❋ ❋

ترس نیشانەی بێغیرەتی نییە، ترسە رێمان پێدەدا لە بەرامبەر بارودۆخەکانی ژیاندا دلێر و بەویقار بین.

❋ ❋ ❋





کەسێك کە ترس ئەزموونـدەکات، بەڵام سەرەڕای ترس دەڕواتەپێش و ڕێگەی پێنادات بیوەستێنێت، دلێریی خۆی دەسەلمێنێت.

❁ .❁ ❁

کەسێك کە بەبێ ڕەچاوکردنی مەترسی، لەگەڵ هەلومەرجە دژوارەکاندا دەستەویەخە بێت، تەنها نابەرپرسیارێتیی خۆی دەردەخات.

❁ .❁ ❁

ژیان بەوردی پنتی بەرامبەر مردنە.

❁ .❁ ❁



مردن واتە تا ئەبەد لە دۆخێکدا مانەوە.

❁ .❁ ❁

هەرچەند لە دروستکراوەکانی خودا نزیکببینەوە، لە دانایی ئەو نزیکتردەبینەوە.

❁ .❁ ❁

شادیی مرۆڤێك بەو مانایە نییە، کە ئەوانی تر دەبێت غەمبار بن.

❁ .❁ ❁

ئەگەر زۆر بە دوای پەیداکردنی ماناوە بین بۆ بوون، دەبینە ڕێگر لەبەردەم نواندنی ڕۆڵی سرووشت و لە تێگەیشتنی ئایاتەکانی خودادا بێتوانا دەبین.

❁ ❁ ❁

کەمبوونی ململانێ ڕۆح لاواز دەکات.

❁ ❁ ❁

خوداوەند هەرگیز لە سەری مرۆڤەوە نایەتە ژووری، دەرگایەک ئەو سوودی لێوەردەگرێت دڵی مرۆڤە.

❁ ❁ ❁



مرۆڤێک کە نەتوانێت لەو شوێنەی تێیدا دەژی شتێک بەرهەم بهێنێت، هێشتا بۆ قسەکردن لەگەڵ خودادا ئامادە نییە.

❁ ❁ ❁

خودا هەرگیز نزای مرۆڤی لەخۆبایی وەڵامناداتەوە.

❁ ❁ ❁

هیچ کات بەر لە هاتنی ڕووداوێک زەینی خۆتان مەشغوڵمەکەن.

❁ ❁ ❁





کەسێك بۆ راکردن لە کێشەکانی سوود لە عیرفان وەردەگرێت، رێیەکی درێژی نابێت.

❋ . ❋ ❋

دەبێت بە هەنگاوی ئاسنین و رێکوپێکییەکی تەواوەوە، هەندێ لە شتەکان جێبەجێبکەن.

❋ . ❋ ❋

ئەگەر کەسێك بێغیرەت و ترسنۆك بێت، خاکەڕایی کارێکی بێسوودە.

❋ . ❋ ❋



ئەوەی راستە ئەمەیە: شتێکت هەبێت و چاوپۆشیی لێبکەیت.

❋ . ❋ ❋

بۆ مرۆڤی دەروونلاواز، کارێکی سادەیە کە بڕواتە دەوروبەر و هەژاریی رەهای خۆی رابگەیەنێت.

❋ . ❋ ❋

کاری خودا ئافەرین بکە و، هەر وەك چۆن بەربەرەکانێ لەگەڵ دونیادا دەکەیت، بەسەر نەفستدا زاڵ بە.

❋ . ❋ ❋





لـە شـتانێکی کـەم بترسـە و هـەموو ترسـت لەسـەر ئەمانـە چڕبکەرەوە. لەم حاڵەتـەدا لـە بەرەنگاربوونـەوە لەگـەڵ بابەتـە گرنگترەکاندا دەتوانیت دلێرانە بجووڵێیتەوە.

❁ . ❁ ❁

لەیادتان بێت، بە پاڕانـەوە نـەك ڕێگایـەکی میهرەبـانتر لەگـەڵ جیهـانی مانـادا بەرقەراردەکـەن، بـەڵکو یارمـەتیی ئـەزموونی ئیرادەش دەدەن.

❁ . ❁ ❁

حەقیقەت بناسە، ئەو کات حەقیقەت تۆ ئازاددەکات.

❁ . ❁ ❁



بۆ هەبوونی ئیمان بە ڕێگایەك کە گرتوومانەتەبـەر، پێویـست بە سەلماندنی خراپیی ڕێگایەکی تـر ناکات. کەسـێك کـە وەها دەکات بڕوای بە ڕێگاکەی خۆشی نییە.

❁ . ❁ ❁

بهێڵە هەر کەس بڕیار لە باوەڕی خۆی بـدات. ئێمـە دادوەری خەونەکانی ئەوانی دی نین.

❁ . ❁ ❁

مرۆڤ هاتە بوون، تا یاری چاکە بێت.

❁ . ❁ ❁

د





هەورەبرووسکە تـەنها دیاردەیـەکی سرووشـتییە، ئەگـەر خـودا دەیەویست لەگەڵ مرۆڤاندا قسانبکات، لە شێوازگەلێکی تا ئـەم ئەندازەیە ناڕاستەوخۆ سوودی وەرنەدەگرت.

❃ ❃ ❃

کەسـێك کـە وادە دەدات و، وەفـاداری نابێـت ناپیـاو و لاواز دەبێت، هەر ئەم بەلاًیەش بەسەر ئەوانەدا دێت، کە دڵیـان بـە وادەکان خۆشدەکەن.

❃ ❃ ❃

هەنـدێ وەهـا بیردەکەنـەوە کـە دەتـوانن بـەڵێنی هـەر شـتێك بدەن، ئەوانی دی هـەر بـەڵێنێك کـە رۆژگـارێکی باشـتریان بـۆ دەستەبەربکات، قبووڵدەکەن.

❃ ❃ ❃



ئەگـەر مـرۆڤ زەمـەنێکی درێـژ لـە جێگایـەکی ئێجگـار باشـدا بژی، دواجار تەمەڵ دەبێت.

❃ ❃ ❃

چارەنووسی هەر مرۆڤێك، چارەنووسی تەواوی مرۆڤەکانە.

❃ ❃ ❃

ئەگـەر تـەنها چـەند کەسـێك مـەحکووم بـن بـەوەی کـە دووچـاری کارەسـاتە گـەورەکان بـن، کەواتـە هەڵەیـەکی زۆر گەورە لە بووندا هەیە.

❃ ❃ ❃

رزگاری فراوانتره له بیرکردنەوە و کردارە مرۆییەکان.

❁ .❁ ❁

مرۆڤەکان دەیانەوێت هەموو شتێك بگۆڕن، لەهەمان کاتدا دەخوازن هەموو شتێکیان وەك خۆیان بمێنێتەوە.

❁ .❁ ❁

هیچ کەس بە چاوی بەستراوەوە ناگاتە ئامانج.

❁ .❁ ❁



ژیان لێوانلێوە لە ململانێ نەناسراوەکان، لە ئەگەری ونبوونی لەناکاوی هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤەکان عادەتیان پێوەگرتوە.

❁ .❁ ❁

گوێڕادێران بۆ جنێو و وەڵامنەدانەوەی هەمیشە ئاسانترە لە کەوتنە جەنگەوە لەگەڵ کەسێکی بەهێزتر لە خۆت.

❁ .❁ ❁

قبوولکردنی سرووشتی باش، هەمیشە باشترە لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەوانی تر و جەنگان بۆ مافەکانی خۆ.

❁ .❁ ❁





هەر کاتێك دەتەوێت بە شتێك بگەیت، چاوانت بکەرەوە. سەرنجبدە و دڵنیابە لەوەی کە بەوردی دەزانیت چیت دەوێت.

❋ ❋ ❋

دووجۆر گێل هەن: ئەوانەی بەهۆی هەڕەشەیەکەوە دەست لە کارێك هەڵدەگرن، ئەوانەش وا گوماندەبەن کە دەتوانن کارێکبکەن چونکە هەڕەشەئامێزە.

❋ ❋ ❋

ترسنۆکان، بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی ناخیان لەوانی دی سوودوەردەگرن، بەڵام ناتوانن بڕیارێکی دیاریکراو بدەن.

❋ ❋ ❋



کارەسات هەمیشە روودەدات، هیچ یەکێك لە هەوڵەکانی ئێمە ناتوانێت ئەو ریزبەندییە چەپەڵەی چاوەڕوانمانە، بگۆڕێت.

❋ ❋ ❋

رەنگە ئامانج بگۆڕدرێت، باشتر یان خراپتر ببێت. ئەمە پەیوەندیی بەو رێگەیەوە هەیە کە دەیگریتەبەر و بە شێوازی هەنگاونانت.

❋ ❋ ❋

لە هەر شوێنێکدا کە بەدوای خودادا دەگەڕێیت، هەر لەوێدا دەیدۆزیتەوە.

❋ ❋ ❋





بەبێ ترس لە وردبوون، گەورەبوون هیچ مانایەکی نییە.

❈ .❈ ❈

ناتوانین لە مردن هەڵبێین.

❈ .❈ ❈

خۆپەسەندی دەبێتە هۆی لەناوچوونمان، چونکە تەڵەزگەکانی مەیدانی شەڕ بەهۆی ئەو متمانەیەی بە خۆمانمان هەیە، نابینین.

❈ .❈ ❈



هیچ کەس ناتوانێت شتێکی زۆری لە ژیان بوێت، چونکە لە شکست دەترسێت.

❈ .❈ ❈

بەهرەکان دیارییەکانی رۆحی پیرۆزن و، لە هەر یەکێك لە ئێمەدا دەردەکەون.

❈ .❈ ❈

مەلەکووتی خوداوەند بۆ منداڵانە.

❈ .❈ ❈

مردن هۆکاری ئەنجامدانی زۆرێك لە کارەکانی ژیانە.

❋ . ❋ ❋

مردن گەورەترین یاوەر و هاوڕێمانە، چونکە مانا دەبەخشێتە ژیانمان.

❋ . ❋ ❋

بۆ بینینی تەوێڵی راستەقینەی مەرگی خۆت، دەبێت سەرەتا هەموو ئارەزووەکان و هەموو ئەو ترسانەی کە تەنها بە بیستنی ناوی ئەو لە بوونەوەرە زیندووەکاندا دەورووژێ، بناسیت.

❋ . ❋ ❋



هیچ شتێك نەشاردراوەتەوە، مەگەر تەنها بۆ ئەوەی ئاشکرا بێت. هیچ شتێك پەنهان نەبوە، مەگەر تەنها بۆ ئەوەی دەربخرێت.

❋ . ❋ ❋

خودایە، رەحمێ بکە بەو کەسانەی کە زوڵم لە خۆیان دەکەن و، لە کردەوەکانی خۆیاندا جگە لە خراپە هیچ شتێکی تر نابینن، ئەوان خۆیان بە بەرپرسیاری هەموو نادادپەروەرییەکانی جیهان دەزانن.

❋ . ❋ ❋

خودایە، رەحمێ بکە بەوانەی کە هیچ کەس لە خۆیان بە باشتر نابینن و، خەڵکی دونیا لای ئەمان بوونەوەرگەلێکی نەناسراو و دوورەدەستن.

❋ . ❋ ❋

سوودوەرگرتن لە هێزی بڕیاردان، بەمانای دابڕینی پەیوەندی و پەیمانشکێنی نییە.

❃ ❃ ❃

فێرکردن واتە، نیشاندانی ئەوەی کە ئەم کارە بۆ خۆمان مومکینە.

❃ ❃ ❃

فێربوون واتە، ئەوەی کە ئەو کارە بۆ خۆمان مومکین بکەین.

❃ ❃ ❃



هەر بڕیارێکی سادە، دەتوانێت پاشماوەی ژیانی مرۆڤێك بخاتە ژێر کاریگەرییەوە.

❃ ❃ ❃

ئێمە دەبێت هەمیشە بە هەمان ئەو چەکە رووبەڕووی دونیا ببینەوە، کە هەڕەشەمان لێدەکات.

❃ ❃ ❃

دوژمن هەمیشە ناسێنەری لایەنی لاوازی ئێمەیە.

❃ ❃ ❃

دوژمــن بۆیــه جــەنگمان لەگەڵــدا دەکــات، چــونکە دەزانێــت لاوازین.

❋ ❋ ❋

ئێمە هەمیشە دەتوانین لە شکستەوە شتێك فێربین، بـەڵام لـە هەڵهاتنـدا تاکـە شـتێك کـە بەدەسـتی دەهێـنین داننانـە بـە سەرکەوتنی دوژمندا.

❋ ❋ ❋

لـە جەنگدا هەمیـشە هەوڵـدەدەین لـە لایـەنی لاوازی خۆمـان بەرگری بکەین.

❋ ❋ ❋



خراپترین شتێك کە دەکرێت رووبدات، هەڵهاتنە لە جەنگ.

❋ ❋ ❋

رێگای بەدەستهێنانی مەعریفەت، هەمیشە هاوکات بـوە لەگـەڵ فیداکاریدا.

❋ ❋ ❋

ئەوانەی خۆیان بە دانا دەزانن، لە کاتی بڕیارداندا دوودڵن و لەکاتی گوێڕایەڵیشدا یاخین.

❋ ❋ ❋

ئـەوەی کـە دەکێڵێـت دەبێـت ئومێـدەوار بێـت، ئـەوەی کـە دەدرووێتەوە دەبێت ئومێدەوار بێت، تا هەر یەك پـشکی خـۆی وەربگرێت.

❋ . ❋ ❋

ئێمە دەمانەوێت لە شوێنێکدا کە هیچ شتێك نییە موعجیزە ببینین، بەڵام کاتێ رووبەڕووی موعجیزەیەکی ئاشکرا دەبینەوە ئینکاری لە هەموو شتێك دەکەین.

❋ . ❋ ❋

تەنها هۆکاری گـەڕان بـەدوای پاداشـتێکدا ئەمەیـە، کـە بـزانین چی لەگەڵ ئەم پاداشتەدا دەکەین.

❋ . ❋ ❋



رێگای بەختیاری بۆ هەر کەسێك جیاوازە و، هـیچ نموونەیـەك نییە کە بیدەینە ئەوانی تر.

❋ . ❋ ❋

هـەموو کەسـێك لـە ژیانـدا دەتوانێـت دوو کـارکردی هـەبێت: دروستکردن یان کێڵان.

❋ . ❋ ❋

هەر ساتەوەختێك لە ژیاندا، کارێکی دەرەنجامی ئیمانە.

❋ . ❋ ❋





هەر رۆژێکی مرۆڤ شەوێکی تاریکە. هیچ کەس نازانێت خوولەکێك دواتر چی روودەدات، لەگەڵ ئەمەشدا هەموان بەرەوپێش دەڕۆن، چونکە متمانەیان هەیە، چونکە ئیمانیان هەیە.

❁ ❁ ❁

رێگای مەعریفەت نەترسانە لە هەڵەکردن.

❁ ❁ ❁

ئێمە ئەبەدیین، چونکە جیلوەیەکین لە خوداوەند.

❁ ❁ ❁



تەواویی خەڵکی جیهان بەهرەیەکی رۆحانییان هەیە، بەڵام هەندێك بە بەهرەیەکی پێشکەوتووەوە دێنە دونیاوە و، ئەوانی تر دەبێت بۆ گەشەپێدانی بجەنگن.

❁ ❁ ❁

هەرچەند زیاتر دەربارەی خۆت بزانیت، ئەم جیهانە پتر تێدەگەیت.

❁ ❁ ❁

هەرکات خەڵك توانیان بۆخاتری بیروباوەڕێك بمرن، بەم شێوەیە نەریت پارێزراو دەبێت.

❁ ❁ ❁

هیچ کەس ناتوانێت بۆ کەسێکی تر بگۆڕدرێت.

❋ .❋ ❋

خودایە، خاکەڕایی داواکردنی خواستەکانمان پێببەخشە، چونکە هیچ ئارەزوێك پووچ و هیچ خۆزگەیەکیش بێهوودە نییە.

❋ .❋ ❋

خوداوەند نرخی کردەوەی دەرەنجامی ئیمانمان دەزانێت، دەستمان دەگرێت و لە نێو نهێنییەکاندا ڕێنوێنیمان دەکات.

❋ .❋ ❋



خودا لە هەر شوێنێکدا کە ئامادەگیی قبووڵبکەین، هەیە.

❋ .❋ ❋

ئازارەکانمان بەو هۆیەوەن، کە وا هەستدەکەین زیاتر لەوەی وەریدەگرین، دەیدەین.

❋ .❋ ❋

دونیا گەورەترە لەوەی کە کەسێك تەنانەت بە واقیعیش بیناسێت.

❋ .❋ ❋





نیگەرانیی ئێمە بۆ حاڵی کەسێکە کە دەترسێت لە چوونە ناو کارێکەوە کە ئایندەکەی ناڕۆشنە و ڕەنگە مەترسیداریش بێت.

❋ .❋ ❋

منالان مایەی ڕەحمەتن، چونکە مەلەکووتی ئاسمانەکان هی ئەوانن.

❋ .❋ ❋

کەسانێك کە هەڵدەدەن ڕۆح بکوژن یاسای خودا ژێرپێدەنێن.

❋ .❋ ❋



دانایی مرۆڤ لەبەرامبەر خودادا جەهلە.

❋ .❋ ❋

هەر کەس بتوانێت بەسەر دڵی خۆیدا زاڵ بێت، بەسەر دونیاشدا زاڵ دەبێت.

❋ .❋ ❋

هەندێ لە خەڵکی دەبێت بەردەوام لە حاڵەتی شەڕ لەگەڵ کەسێکدا بن، هەندێجار تەنانەت لەگەڵ خۆیان و ژیانی خۆشیاندا دەجەنگن.

❋ .❋ ❋

ژیان غافلگیرمان دەکا و فرمانمان بەسەردا دەدا، کە بەرەو نەناسراو بڕۆین، تەنانەت کاتێك نامانەوێ و وەها بیردەکەینەوە کە هیچ پێویستیشمان بەم کارە نییە.

❋ ❋ ❋

بیرکردنەوە لە ئایندە ترسناکە.

❋ ❋ ❋

ئەوانەی کە زاری چارەنووسی ئێمە هەڵدەدەن، لێمان ناپرسن کە ئایا دەمانەوێت لە یارییەکەدا بەشدار بین یان نا.

❋ ❋ ❋



هەموو بوونەوەران هەمیشە دەستدەخەنە ناو دەستی یەك، تا یارمەتیی کەسێك بدەن کە بەدوای خەونەکانی خۆیدا دەڕوات.

❋ ❋ ❋

خەونەکانی ئێمە هی خۆمانن و تەنها ئێمەین دەتوانین ئەو هەوڵەی بۆ زیندووڕاگرتنیان پێویستە، بزانین.

❋ ❋ ❋

بوونەوەران هەمیشە یارمەتیمان دەدەن، تا بۆ خەونەکانمان بجەنگین.

❋ ❋ ❋





خودا له لاوازیی بەندەکانی بە ئاگایە.

❁ . ❁ ❁

ئەی خودای من، هەرچییەك ویستی تۆی لەسەر بێت هەر ئەوە دەبێت، چونکە تۆ لە لاوازیی دڵی بەندەکانت بەئاگایت و تەنها بە ئەندازەی توانای هەر کەسێك قوورسایی دەخەیتە سەر شانیان.

❁ . ❁ ❁

بۆ خزمەتکردن بە خودا، ڕێگاگەلێکی زۆر هەن.

❁ . ❁ ❁



چاوەڕوانی دوای ئازارە، فەرامۆشکردنیش بە ئازارە.

❁ . ❁ ❁

ئازاری سەرگەردانی لە هەر شتێکی تر زیاترە.

❁ . ❁ ❁

بەشێوەیەکی ئاسایی خەڵکان لە ڕۆژێکدا دەمرن، کە کەمتر لە ڕۆژانی تر چاوەڕێی مەرگن.

❁ . ❁ ❁





مرۆڤ هەوڵدەدات بە زیندوویی بمێنێتەوە، نەوەك ئەوەی خۆی بکوژێت.

❋ . ❋ ❋

هەر گۆڕانکارییەکی گەورە لە ژیاندا، دەتوانێت ببێتە هۆی ژاکان.

❋ . ❋ ❋

هیچ کەسێك بەو بابەتانەی خەڵکی تر پێی دەڵێن هیچ فێرنابێت، دەبێت خۆی پەی بە هەموو شتێك ببات.

❋ . ❋ ❋



دەبێت لەو جۆرەی مرۆڤ بین، کە هەر بڕیارێك دەیدەن پێوەی پابەندن و، هەمیشە تا کۆتاییی ڕێ دەڕۆن.

❋ . ❋ ❋

دەبێت بەسەر خاڵە لاوازییە بچووکەکانماندا زاڵ بین، بۆ ئەوەی ببینە شایانی هەندێ بابەت کە گرنگیی سەرەکییان هەیە.

❋ . ❋ ❋

هەندێ لە خەڵکی هەرچەند دەرەتانی شادییان زیاتر بێت، غەمگینتر دەبن.

❋ . ❋ ❋

واقیعیەت هەمان شتێکە کە زۆرینە بە واقیعیەتی دەزانن، مەرج نییە ئەمەش باشترین یان لۆژیکیترین بێت.

❋ ❋ ❋

شێت خۆی دەکوژێت، قارەمان دەبێتە فیدای ئامانجێك و خۆی لەپێناویدا شەهیددەکات.

❋ ❋ ❋

هەم قارەمانان و هەم دێوانان بەرامبەر بە مەترسی بێباکن و توند و کتوپڕ دەڕۆنەپێش، بێئەوەی هیچ گرنگی بە قسەی خەڵکی بدەن.

❋ ❋ ❋



بێمانابوونی ژیان خەتای هیچ کەس نییە، جگە لە خۆمان.

❋ ❋ ❋

دێوانەتر لە هەموان ئەوانەن کە نازانن دێوانەن.

❋ ❋ ❋

دێوانەیی لەگەڵ نەبوونی کۆنترۆڵدا بەهەڵە مەگرن.

❋ ❋ ❋





کەسانی بە ئەزموونتر بەسەر کەسانی بێفێڵ و ساختەدا سەردەکەون.

❁ ❁ ❁

کارکردن باشترین دەرمانە.

❁ ❁ ❁

ترسی لەڕادەبەدەر جۆرێکە لە ناهاوسەنگی.

❁ ❁ ❁



هەمووومان ڕێگەمان پێدراوە، لە ژیاندا دونیایەك هەڵە بکەین، جگە لەو هەڵەیەی لەناومان دەبات.

❁ ❁ ❁

هۆشیاری لە مەرگ دەمانخاتە شەوقەوە و وامان لێدەکات بە جۆشوخرۆشێکی زیاترەوە بژین.

❁ ❁ ❁

شتێك یەکجار ڕووبدات لەوانەیە هەرگیز ڕوونەداتەوە، بەڵام ئەگەر دووجار ڕووبدات بە دڵنیاییەوە جاری سێیەمیش ڕوودەداتەوە.

❁ ❁ ❁

پرسیارێك هەیە كە هەمیشە پێش دەستپێكردنی هەر كارێك دەبێت وەڵامێكمان بۆی هەبێت: بۆچی دەبێت ئەم كارە بكەم؟

❋ ❋ ❋

مرۆڤەكان رەنگە ئەسڵی خۆیان لەبیربكەن، بەڵام سرووشت هەرگیز فەرامۆشیان ناكات.

❋ ❋ ❋

لەگەڵ ئەندێشەكانتان مەجەنگن، ئەوان لە ئێوە بەهێزترن.

❋ ❋ ❋



ئەگەر دەتەوێت لەدەست بیركردنەوەكانت نەجاتت بێت، دەبێت قبووڵیان بكەیت.

❋ ❋ ❋

هەورەكان ئەو رووبارانەن كە دەریا دەناسن.

❋ ❋ ❋

یەكەمین فەزیلەتی گەورەی مرۆڤایەتی هەنگاونانە لەرێگای مەعنەویەتدا، دلێرییە.

❋ ❋ ❋





نابێت بهێڵین له هیچ مەسەلەیەکدا ترس بەسەرماندا زاڵ بێت.

❉ . ❉ ❉

دلێر بن و بەدوای خەونەکانی خۆتاندا بڕۆن.

❉ . ❉ ❉

لەبیرتان بێت ئێوە دەرخەری بوونی ڕەهان و، تەنها ئەو کارانە له ژیانتاندا جێبەجێدەکەن که بەهای هەوڵبۆدانیان هەیە.

❉ . ❉ ❉



جیهانەکەی تر بۆ هەموو ئەو کەسانە دەبێت، که باوەڕیان پێی هەیە.

❉ . ❉ ❉

تـەنهاڕێی دۆزینـەوەی ڕێگاچـارەی ڕاسـت، ناسـینی ڕێگاچـارە هەڵەکانە.

❉ . ❉ ❉

بە هۆشیاربوون له مەرگ مـرۆڤ دەتوانێت زۆر دلێرتـر بێـت و له فتووحاتە ڕۆژانەییەکانیدا زۆر زیاتر بڕواتەپێش، چونکە که مردن حەتمییە هیچ شتێکی نییە لەدەستی بدات.

❉ . ❉ ❉





مەرگ حەتمییە.

❁ .❁ ❁

هەمیشە باشترین رێگا کە بیپێوین، دەبینین بەڵام تەنها ئەو رێگایانە تەیدەکەین کە عادەتمان پێیانەوە گرتوون.

❁ .❁ ❁

کار تەنها کاتێك کامڵە کە گەیشتبیتە مەبەست.

❁ .❁ ❁



گەورەترین گووناه لە دونیادا، پەشیمانییە.

❁ .❁ ❁

بەرلەوەی دەستت بتوانێت شمشێرەکەت بگرێت دەبێت کەشفی بکەیت کە دوژمنەکەت لەکوێیە و، چۆن دەبێت مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، شمشێر تەنها دەوەشێنێت بەڵام دەستت تەنانەت پێش هێنانەخوارەوەی لێدان سەردەکەوێت یان شکستدەخوات.

❁ .❁ ❁

کەسێك کە بەدوای حیکمەتدا رادەکات، پێویستی بە رێگایەکە بۆ دەستەبەرکردنی خەونەکانی.

❁ .❁ ❁





ئەمە گەورەترین درۆیە: ئەوەی کە هەر کەسێك لە ساتێکی ژیانیدا هەڵبژاردنی خۆی بەسەر ئەو رووداو و کارەساتانەی لێی روودەدەن، لەدەستدەدا و هەڵبژاردنی ژیانی دەکەوێتە دەست چارەنووس.

❁ ❁ ❁

هەرچەند تەمەن تێپەڕێت، هێزێکی هێمادار دەکەوێتەکار تا قەناعەت بە لاوان بکات کە مەحاڵە بتوانن ئەفسانەی کەسییان دەستەبەربکەن.

❁ ❁ ❁

رۆحی جیهان لە شادیی خەڵك گەشەدەکات، هەروەها لە خەم و ئیرەیی و حەسادەتیش.

❁ ❁ ❁



دەستەبەرکردنی ئەفسانەی کەسی، تەنها بەڵێنی واقیعیی هەر مرۆڤێکە.

❁ ❁ ❁

خوداوەند بۆ هەر کەسێك لە ژیانیدا رێگایەکی داناوە، کە دەبێت بیبڕێت.

❁ ❁ ❁

هەر کاتێك خوازیاری شتێك بین، هەموو بوونەوەر دەستدەخاتە ناو دەستی یەك تا ئێمە بەو خواستەمان بگەین.

❁ ❁ ❁





دونیا هەر بەو جۆرە دەبینین، کە دەمانەوێت بیبینین نەک بەو جۆرەی بەڕاستی هەیە.

❋ ❋ ❋

بڕیاردان تەنها سەرەتای کارە.

❋ ❋ ❋

کاتێ بڕیاردەدەین، بەشێوەیەکی کرداری لەنێو پرۆسەیەکی گەرموگوڕدا مەلەدەکەین و بۆ شوێنانێکی وەهامان دەبەن، وەختێ بڕیاردان تەنانەت هەر نەماندەتوانی بیریشیان لێبکەینەوە.

❋ ❋ ❋

هەر رەحمەتێک گەر رەچاونەکرێت، بۆ نەعلەت دەگۆڕێت.

❋ ❋ ❋



هەر کاتێک لە ناخی دڵمانەوە شتێکمان بوێت، زیاتر لەکاتەکانی تر لە رۆحی جیهان نزیکبووینەتەوە.

❋ ❋ ❋

رۆحی جیهان، هەمیشە هێزێکی پۆزەتیڤە.

❋ ❋ ❋

کەسێك کە پەیوەست دەبێت بە کاروانەوە، ئەگەر بیەوێت تەنها پشتئەستوور بێت بە دلێریی کەسیی خۆی، بەبێ ئەوەی ئەم زمانە درکپێبکات سەفەر بۆی خەتەرناکتر دەبێت.

❋ ❋ ❋

ژیان تەنها ئەم چرکەساتەیە کە تێیداین.

❋ ❋ ❋

ئەم جیهانی سرووشتە تەنها وێنە و تەقلیدێکە لە بەهەشت.

❋ ❋ ❋

مرۆڤ بە روانینە ئەو شتەی لە دەوروبەریدا روودەدات، دەتوانێت ڕێگایەك بۆ چوونە نێو رۆحی جیهانەوە بدۆزێتەوە.

❋ ❋ ❋

رازی داهاتوو لە ئێستادایە، ئەگەر سەرنجبدەیتە ئێستا دەتوانیت باشتری بکەیت. ئەگەر ئێستا باشتر بکەیت ئەوا ئەوەی دوای ئەو روودەدات باشتر دەبێت.

❋ ❋ ❋

سەبارەت بە داهاتووت بێخەیاڵبە و هەموو رۆژێك بەپێی وانەکانی هەمان رۆژ، بە خاترجەمی لەوەی کە خودا بەندەکانی خۆشدەوێت، بژی.

❋ ❋ ❋



هەموو رۆژێك رۆژێکە بۆ ژیان، یان رۆژێك بۆ جێهێشتنی ئەم جیهانە!

❋ ❋ ❋

هەموو شتێك پەیوەندیی بە چارەنووسەوە هەیە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر هەر شتێك کە مرۆڤ دەیدۆزێتەوە پوخت بێت، هەرگیز خراپ نابێت و، مرۆڤ هەمیشە دەتوانێت بگەڕێتەوە، بەلاّم ئەگەر ئەو شتەی دۆزیویەتییەوە، تەنها رووناکییەکی زووتێپەڕی وەك تەقینەوەی ئەستێرەیەك بێت، کاتێك گەڕایەوە هیچی نەدۆزیوەتەوە.

❋ ❋ ❋

بیرکردنەوە لە دەنکەلێك سادەیە، بەلاّم تێیدا هەموو سەرسووڕهێنەرییەکانی بوونەوەر دەبینیت.

❋ ❋ ❋





به دڵت بڵێ كه ترس له ئازار له خودی ئازار خراپتره.

❋ .❋ ❋

بـوونی ئـهم جیهانــه ئـهو متمانهیــه بــه مــرۆڤ دهدات، كـه جیهانێكی تر بوونی ههیه، جیهانێكی كامڵ.

❋ .❋ ❋

خوداوهند ئهم جیهانهی بۆیه دروستكرد، تا مرۆڤ لهڕێی ئـهو بوونهوهرانهی دهیبینێت، چهند وانهیهكی مهعنهوی فێربێت و، سهرسووڕهێنهرییهكانی حیكمهتی ئهو دركبكات.

❋ .❋ ❋

ئێمــه هــهرگیز نــاتوانین لــه دڵـی خۆمــان راكــهین، كهواتــه باشتروایه گوێ بۆ ئهو قسانهی ههمانه، رادێرین.

❋ .❋ ❋



مــرۆڤ دهترسـێت لـهوهی كـه بـهدوای گـرنگترین خهونـهكانی خۆیـدا بـڕوات، چـونكه وا هەسـتدهكات لێوهشـاوهیی ئــهوهی نییه، یان ناتوانێت پێی بگات.

❋ .❋ ❋

هـهرگیز هـیچ دڵێـك كـه لـه سـۆراغی خهونـهكانی خۆیدایـه، ناكهوێتــه ئــازارهوه، چـونكه هــهر چركهسـاتێك لــه گهڕانیـدا، چركهساتی دیداره لهگهڵ خودا و ئهبهدییهتدا.

❋ .❋ ❋

ههموو كهسێ گهنجینهیهكی لهسهر زهویدا ههیه، كه چاوهڕێی دهكات.

❋ .❋ ❋

ههموو كهسه خۆشبهختهكان خودایان له دڵدا ههیه.

❋ .❋ ❋





هیچ كەسێك لە ئازاری دەرەنجامەكانی ئەو شتەی كە لەژێر ئاسماندا روودەدات، لە ئەماندا نییە.

❋ ❋ ❋

مەترسیی مەرگ رادەی هۆشیاریی مرۆڤ لە ژیان زۆر زیاتر دەكات.

❋ ❋ ❋

تەنها یەك شت دەستەبەربوونی خەونەكان بە مەحاڵ دەگەیەنێت، ئەویش ترسە لە شكست.

❋ ❋ ❋

كەسێك كە بەدوای ئەفسانەی كەسیی خۆیدایە، ئەو شتەی دەبێت بیزانێت، دەیزانێت.

❋ ❋ ❋



جیهان تەنها بەشی بینراو و ئاشكرای خودایە.

❋ ❋ ❋

لەبری نەفرینكردنی ئەو شوێنەی كە تێیدا بە زەوی كەوتوویت، دەبێت كەشفی بكەیت چ شتێك بۆتە هۆی خلیسكان و بەزەویكەوتنت.

❋ ❋ ❋

كاتێك مرۆڤ هەستدەكات رۆحی ناڕازییە، ناتوانێت پەندوەربگرێت.

❋ ❋ ❋

راستە هەموو شتێك نرخێكی هەیە، بەڵام نرخ هەمیشە رێژەییە.

❋ ❋ ❋

ئەوەی خەڵکانی تر بیری لێ دەکەنەوە، گرینگ نییە، ئەوەی گرینگە هەست بەئارامیکردنی دڵە.

❋ . ❋ ❋

ئەگەر وزەیەکی پۆزەتیڤ لە فەزادا ڕەهابکەیت، ئەو وزەیە وزەگەلێکی پۆزەتیڤی زیاتر ڕادەکێشێت و لێیانەوە مرۆڤانێك دروستدەکات کە شادومانیی تۆیان دەوێت.

❋ . ❋ ❋

حەسوودان و شکستخواردوان، تەنها کاتێك دەتوانن ئازار بە تۆ بگەیەنن، کە خۆت توانای ئەم کارەیان پێبدەیت.

❋ . ❋ ❋

لێبووردن شەقامێکی دووسەرە.

❋ . ❋ ❋



هەر کاتێ لە کەسێك دەبوورین، لە خۆشمان خۆشدەبین.

❋ . ❋ ❋

ئەگەر سەبارەت بەوانی تر خۆڕاگر بین، قبوولکردنی هەڵەکانی خۆمان سادەتر دەبێت.

❋ . ❋ ❋

کاتێك بەهۆی لاوازییەوە ڕێگە بە نەفرەت، ئیرەیی و دەمارگیری دەدەین لە نزیکماندا هەبن، پاش ماوەیەکی کەم خۆشمان لە ئەسارەتی ئەواندا دەبینینەوە.

❋ . ❋ ❋





کــردەی لێخۆشــبوون، خــودی بــاڵا پــاکیزە دەکــا و نــووری ڕاستەقینەی خودایەتیمان لێ ئاشکرادەکات.

❋ ❋ ❋

هەرگیز ڕێگا بە خوو مەدە بەسەر بزاوتەکانتدا زاڵ بێت .

❋ ❋ ❋

دژی ڕۆحـــت گوونـــاه مەکـــە، بـــەڵام بێحوورمـــەتی بـــە سەخاوەتمەندیی زەویش مەکە.

❋ ❋ ❋



نرخــی بەدواداچــوونی خەونــەکان هەرچــەندێکیش زۆر بێــت ناگاتە نرخی نەژیان بەپێی ئەفسانەی کەسی.

❋ ❋ ❋

پیاوی گەمژە هەمیشە وەها بیردەکاتەوە زیاترە لە خەڵکانی تر.

❋ ❋ ❋

دانـــا کەســـێکە، لـــەجێی کوشـــتنی مەیلـــەکانی توانـــای کۆنترۆڵکردنیانی هەیە.

❋ ❋ ❋





کاتێك بڕیارێکت دا، بەدیلەکەی تر فەرامۆشکە.

❋ ❋ ❋

کاتێك کارەکان باش ناڕۆنەپێش، تەنها لەوانەیە دوو ئەگەر لە ئارادابن: یان تواناکانت تاقیدەکرێنەوە، یان دەبێت ڕێگاکەت بگۆڕیت.

❋ ❋ ❋

ترس لە هەڵەکردن هۆکارێکە کە ئێمە لە قەڵای ڕاڕاییدا زیندانیدەکات.

❋ ❋ ❋



ئەگەر بتوانین بەسەر ترسی خۆماندا زاڵ بین، هەنگاوێکی گرینگمان بەرەو ئازادیی خۆمان هەڵگرتوە.

❋ ❋ ❋

لە ڕۆحت بپرسە کە چیی دەیەوێت. کاتێك ڕۆحت لەگەڵ خەونەکانت هاوئاهەنگ بێت، خوداوەند خۆشحاڵ دەبێت.

❋ ❋ ❋

دانای ڕاستەقینە کەسێکە، خاکەڕا بێت.

❋ ❋ ❋





ئەگەر درەختێ هیچ بەرهەمێکی نەبێت، لقەکانی لەخۆبایی و گەردنکەش دەبن.

❁ . ❁ ❁

نان، میوەی زەوی و ئازاری مرۆڤە.

❁ . ❁ ❁

تەواوی ڕێگاکان لە یەك جێگادا کۆتاییان دێت، بەڵام تۆ ڕێگای خۆت هەڵبژێرە و تا کۆتایی لەگەڵیدا بڕۆ. هەوڵمەدە پیاسە بە هەموو ڕێیەکاندا بکەیت.

❁ . ❁ ❁



ناتوانرێت هەر بەو شێوەیەی بیرکاری دەگوێزرێتەوە، ئیمان بگوازرێتەوە.

❁ . ❁ ❁

رازی ئیمان قبوولبکە، جیهان خۆی ئەو رازە بۆ تۆ ئاشکرادەکات.

❁ . ❁ ❁

نووسین یارمەتیمان دەدات، کە سەروسامان بدەینە بیرو تێڕوانینەکانمان، بۆ ئەوەی دونیا بە روونییەکی زیاترەوە ببینین.

❁ . ❁ ❁





بە نووسین، لە خودا و ئەوانی تر نزیکتردەبینەوە.

❋ ❋ ❋

قەڵەم و کاغەز موعجیزە دروستدەکەن، ئازارەکان هێوردەکەنەوە، خەونەکان دەگۆڕن بۆ کردەوە و ئومێدە لەدەستچووەکان زیندوودەکەنەوە.

❋ ❋ ❋

تەنها جورئەتی هەنگاوهەڵگرتنە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕێگا خۆی ئاشکرا بکات.

❋ ❋ ❋



خودا لە ژیاندایە و ژیان لە خودادا.

❋ ❋ ❋

ئەگەر بتوانین بچینە نێو هەماهەنگیی پیرۆزی ژیانەوە، هەمیشە لەسەر ڕێگای ڕاست دەبین و دەتوانین کارەکەی خۆمان تەواوبکەین.

❋ ❋ ❋

بۆ باشتر ژیان، تەنها ئەوە خۆمانین کە دەزانین چ شێوەیەك بۆ خۆمان هەڵبژێرین.

❋ ❋ ❋

هەروەك پەردەی سینەما، خودا لەپشت هەموو ئازار و خۆشحاڵییەکانی ژیانی مرۆڤەکانەوەیە. کاتێك فیلمەکە تەواو دەبێت دەتوانین ئەو ببینین.

❋ ❋ ❋

کەسێك کە ناتوانێت لەنێوان کار و پشووداندا هاوسەنگی بکات، بێگوومان جۆشوخرۆش لەدەستدەدا و جێگایەکی دوور نادۆزێتەوە.

❋ ❋ ❋

پەرستش لقی دارێکە، ئیمان رەگەکەیەتی. ئیمانی بێ پەرستش رەنگە بوونی هەبێت، بەڵام پەرستش بێ ئیمان مومکین نییە.

❋ ❋ ❋



ژیان پڕە لە موعجیزە بچووك و گەورەکان.

❋ ❋ ❋

لە ژیاندا هیچ شتێکی تەمەڵکەر نییە، چونکە هەموو شتێك لە گۆڕانێکی بەردەوامدایە.

❋ ❋ ❋

یەکڕیتمی سەر بەم دونیایە نییە.

❋ ❋ ❋





خوداوەند بەتوانای ڕەهایە. ئەگەر ئەو خۆی سنووردار بکات بە ئەنجامدانی ئەو شتەی ئێمە بە خێری دەزانین، ناتوانین بە بەتوانای ڕەهای ناوبنێین، چونکە لەم حاڵەتەدا تەنها بەسەر بەشێك لە جیهاندا حوکمدەکات.

❋ .❋ ❋

مرۆڤ بۆیە دێتە دونیاوە تا خیانەت لە چارەنووسی خۆی بکات.

❋ .❋ ❋

لەوانەیە مرۆڤەکان بەو هۆیەوە خیانەتیان لە چارەنووسی خۆیان کردبێت، کە خواوەند لێیانەوە دووربۆتەوە.

❋ .❋ ❋



ڕەنگە دایکان و باوکان لەوە بترسن، کە ئێمەش هەڵەکانی ئەوان دووبارەبکەینەوە.

❋ .❋ ❋

من خەریکم شتێك فێردەبم، تەنانەت ئەگەر ئەم فێربوونە بێهوودەش بێت چونکە من مەحکوومم بە مەرگ.

❋ .❋ ❋

ڕۆحی مرۆڤەکانیش پێویستیی بە خواردن هەیە.

❋ .❋ ❋

ئەگەر رۆحی من هێشتا نەمردوە، لەبەرئەوەیە کە قسەیەکی بۆ گووتن هەیە.

❋ .❋ ❋

ئەو کاتەی مرۆڤێك بەرەو چارەنووسی خۆی هەنگاوهەڵدەگرێت، زۆر کات ناچار دەبێت ڕێگاکەی خۆی بگۆڕێت.

❋ .❋ ❋

مرۆڤ بەر لەدەستەبەربوونی چارەنووسی خۆی، دەبێت چەند قۆناغێکی جیاجیا ببڕێت.

❋ .❋ ❋



لە هەر تەمەنێکدا خوداوەند سەرقاڵیی تایبەت بە مرۆڤەکان دەدات.

❋ .❋ ❋

ئەگەر کەسێك یارمەتییەکی لە من ویست، ئەمە بەو مانایەیە کە هێشتا لەسەر رووی زەویدا بەهایەکم هەیە.

❋ .❋ ❋

باشترین ڕێگا بۆ ناسین و لەناوبردنی دوژمن ئەوەیە کە خۆمان بە دۆستی ئەو بنوێنین.

❋ .❋ ❋

کەسێك سەبارەت بەخۆی گوومان ناکات، شایستە نییە چونکە متمانەیەکی کوێرانەی بە خۆی هەیە، کە رەنگە دووچاری لووتبەرزیی بکات.

❁ ❁ ❁

فریشتەکانی خوداوەند لەگەڵ مرۆڤەکاندا قسەناکەن، ئەوان تەنها فرمانی یەزدان رادەگەیەنن.

❁ ❁ ❁

هەموو خەڵکی هێزی پێویستیان هەیە، بەلاّم هیچ کات کەسێك لە هێزی خۆی سوودوەرناگرێت.

❁ ❁ ❁



لە هەر چرکەساتێکی ژیانت سوودوەربگرە، ئەگەر ناتەوێت دواتر خۆزگە و پەشیمانیت هەبێت.

❁ ❁ ❁

هێزی پیاو لەو بڕیارانەدا شاردراوەتەوە، کە دەیدات.

❁ ❁ ❁

کەسێك کە هەڵنابژێرێت، هەتا ئەگەر هەناسەش بدات، لە چاوانی خواوەنددا مردوە.

❁ ❁ ❁

بۆ هەر شتێك کە لەژێر هەتاودا دەژی، هۆکارێك هەیە.

❁ ❁ ❁





ماناى ژيانى من هەمان ئەو مانايەيە كە خۆم دەمەوێت پێيبدەم.

❁ ❁ ❁

جەنگاوەرى ڕێگاى ڕۆشنايى، ڕۆژەكانى خۆى بەهەدەرنادات، تا ڕۆڵێك بگێڕێت كە ئەوانى تر بۆى هەڵدەبژێرن.

❁ ❁ ❁

جەنگاوەرى ڕێگاى ڕۆشنايى، هەميشە باشترين بەشى بوونى خۆى پێشكەشدەكات، هەر ئەمەش لەوانى تر چاوەڕێدەكات.

❁ ❁ ❁

جەنگاوەرى ڕێگاى ڕۆشنايى، هەميشە درەوشانەوەيەكى تايبەت لە نيگاكانيدا هەيە.

❁ ❁ ❁



جەنگاوەرى ڕێگاى ڕۆشنايى، لە داوەريكردن سەبارەت بە خەونەكانى ئەوانى تر بەرپرسيار نييە، كاتى خۆى لە ڕەخنەگردنى بڕيارەكانى ئەوانى تردا بەهەدەرنادات.

❁ ❁ ❁

ئێمە باس لە ئازادى دەكەين و حاڵ ئەوەيە ئەسيرى گووناهەكانى خۆمانين.

❁ ❁ ❁

بۆ زاڵبوون بەسەر كەسێكدا، كارێك بكە كە بترسێت.

❁ ❁ ❁

با ئاگرى حيكمەت ڕێگامان بۆ ڕۆشنبكاتەوە.

❁ ❁ ❁

**ئێمە نە باشتر و نە خراپترین لە کەسانێك، کە بەرامبەرمان رووگرژدەکەن.**

❁ . ❁ ❁

**خاکی ئەم جیهانە لە ترسەکانی ئێمەوە کۆبۆتەوە.**

❁ . ❁ ❁

**با ئاگری دادپەروەری هەنگاوەکانمان رێنوێنی بکات.**

❁ . ❁ ❁

**بەر لەوەی ئێمە بێینە دونیاوە، ژیان بوونی هەبوە. دوای ئەوەش کە ئێمە لەم دونیایە دەڕۆین، هەر بەردەوام دەبێت.**

❁ . ❁ ❁



**گۆڕینی ئەو شتەی لە دەرەوەیە دژوارترە لە گۆڕینی ئەو شتەی لە ناوەوەیە.**

❁ . ❁ ❁

**ژیان دەتوانێت بەپێی شێوازی ژیانی ئێمە کورت یان درێژ بێت.**

❁ . ❁ ❁

**چارەنووسی مرۆڤێك چارەنووسی خودی مرۆڤایەتییە.**

❁ . ❁ ❁

**دەبێت خراپە دەرکەوێت، تا بەهای چاکە درکپێبکەین.**

❁ . ❁ ❁





هەمیشە چاکە حوکمدەکات.

❀ ❀ ❀

مرۆڤ پێویستیی بە نزمترینی خراپییەکان هەیە لە بوونیدا، بۆ ئەوەی بگاتە بەرزترین باڵاییەکانی بوونی.

❀ ❀ ❀

ئەو خەڵکەی هیچ شتێکیان نییە لەدەستی بدەن، هەرگیز بیر لە ژیانی ئەبەدی ناکەنەوە.

رئەی پەروەردگار، بە رەحمی بێپایان و بە عەشقی بێپایانی خۆت بمانبەخشە.

❀ ❀ ❀



**سەرچاوەکان**

١- کێوی پێنجەم
٢- داستانگەلێك بۆ باوکان، مناڵان و نەوەکان
٣- شەیتان و خانم پریم
٤- حاجیی کۆمپۆستێلا
٥- ڤاڵکیرییەکان
٦- دیدارێك لەگەڵ فریشەکاندا
٧- کیمیاگەر
٨- سەفەر بۆ دەشتی ئەستێران
٩- لە کەنار رووباری پیدرادا دانیشتم و گریام.
١٠- ڤێرۆنیکا بڕیاردەدات بمرێت.
١١- مەکتووب



